


# ژیانی پێشەوای ئازیزمان

ئامادەکردنی: سالار عومەر

## قۆناغی چوارەم

# ژیانی پێشەوای ئازیزمان ﷺ

## قۆناغی چوارەم:

### کۆچ کردن بۆ حەبەشە
### تاکو
### کۆچ کردن بۆ مەدینە

ئامادەکردنی:
سالارعمر



بسم الله الرحمن الرحيم

## ناسنامەی کتێب

**ناوی کتێب : ژیانی پێشەوای ئازیزمان محمد ﷺ**

**ئامادەکردنی: سالارعمر**

**نەخشەسازی ناوەوە: عبدالله خاکی**

**دیزاینی بەرگ : ڕێدارعومەر**



# بەرهەمی: پڕۆژەی ئاگا

## ناونیشانی پڕۆژەی ئاگا لە تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان


Aga project :: پڕۆژەی ئاگا


Aga project :: پڕۆژەی ئاگا


٠٧٥٠٧١٤٧٠٣٧


٠٧٥٠ ٧١٤٧٠٣٧


@aga_kteb



## کۆچ بۆ حەبەشە
## یەکەم کۆچ لە مێژووی مسوڵمانان

سەرەتای چەوساندنەوەکان لە ساڵی چوارەمی کۆچی بە کزی دەستی پێکرد، پاشان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر بوو هەتا لەساڵی پێنجەمی پێغەمبەرایەتی دا ئازارو ئەشکەنجە و نارەحەتیەکان بۆ سەر هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) ڕوولەزیادبون بوو و نارەحەتییەکان سەختتربوون، ئەمە هاوکات بوو لەگەڵ هاتنەخوارەوەی سورەتی کەهف بۆ سەر پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) یەکێک لەو چیرۆکانەی خودا باسی دەکات لەم سورەتەداچیرۆکی هاوەڵانی ئەشکەوت(اصحاب الكهف) ە کەباس لە کۆچی کۆمەڵێ یەکخواپەرست دەکات لەدەستی ستەم.[1]

سورەتەکە سێ چیرۆکی لە خۆی گرتبوو و چەند ئامۆژگاریی و ڕێنماییەکی تێدا بوو لە خوای گەورەوە بۆ باوەڕداران، بەسەرهاتی هاوەڵانی ئەشکەوت ڕێنماییانی کرد بۆ کۆچکردن و وازهێنانی لە شوێنی بێباوەڕی و دەستدرێژی سەر ئایین بە پشت بەستن بە خوای گەورە: {وَإِذِ اعْتَزَلْتُمُوهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ إِلَّا اللَّهَ فَأْوُوا إِلَى الْكَهْفِ يَنْشُرْ لَكُمْ رَبُّكُمْ مِنْ رَحْمَتِهِ وَيُهَيِّئْ لَكُمْ مِنْ أَمْرِكُمْ مِرْفَقًا}[2] واتە: کاتێ ئێوە دوورە پەرێزیتان گرت لەوان و لەو (پەرستراو) انەش بێجگەلە خوا دەیان پەرستن دە پەنا بە ئەشکەوتەکە بەرن پەروەردگارتان بڵاوی دەکاتەوە بۆتان بەزەیی و ڕەحمەتی خۆی و بۆتان فەراهەم دەهێنێ لەم کارەتاندا هۆی گوزەران و ژیانتان.

[1] الرحيق المختوم _الطبعه الاولى١٤١٣هـ١٩٩٣م
[2] الكهف_١٦

هەریەک لە چیرۆکی خضر و پێغەمبەر موسی"سەلامی خوای گەورەی لێ بێت" و ذولقرنەین ئاماژەیەکی تایبەتی تێدا بوو بۆ باوەڕداران.

بۆیە پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ لە ڕەجەبی پێنجەمین ساڵی پێغەمبەرایەتی فەرمانی کرد بە کۆچکردنی موسڵمانان بۆ حەبەشە فەرمووی (ئەو وڵاتە پاشەیەکی هەیە کە تێیدا کەس ستەمی لێ ناکرێت)، ویەکەم کاروانی هاوەڵان بۆ حەبەشە پێکهاتبوون لە ١٢ پیاو و چوار ژن بوون، بە سەرکردایەتی (عوثمانی کوڕی عەفان)، و هاوسەرەکەی خاتوو (ڕوقیە)ی کچی پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ لەگەڵدا بوو.[١]

پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ لە بارەیانەوە فەرمووی: (ئەوە یەکەم ماڵە لە دوای ماڵەکەی ئیبراهیم و لوط"سەلامی خوای گەورەیان لێ بێت" کۆچی کرد بێت).

ئەم پۆلە بە شێوەی دزەپێکردنێکی شەوانە لە ڕێگای دەریاوە بەرەو حەبەشە بەڕێ کەوتن هەتا قوڕەیش پێیان نەزانێت، کاتێک کە قوڕەیشییەکان پێیان زانی و گەیشتە کەناری دەریا ئەوان بە باشترین شێوە میوانداری کرابوون لە خاکی حەبەشەدا.

لە ئەو ڕۆژانەدا پێغەمبەری خوای گەورە ﷺ سورەتی "النجم"ی بەسەردا دابەزی، و لە ڕەمەزانی هەمان ساڵدا هەستا بە خوێندنەوەی بەسەر بێباوەڕانی قوڕەیش لە مەککەدا، ئیبن مەسعود دەفەرمێت( پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ سورەتی "النجم"ی خوێند لە مەککە و سوجدەی تیا برد و هەرچی بێباوەڕ هەبوو لە دەورەبەریدا هەموویان کە پێغەمبەر ﷺ سوجدەی برد ئەوانیش سوجدەیان

[١] ژیانی پێغەمبەری خوا لەقورئان و فەرمووده صەحیحەکاندا.(محمد مەلا فایەق شارەزووری)



بـرد لە خۆیـانەوە تەنهـا پیاوێـک نەبێـت پیر بـوو مشـتێک زیخی هەڵگـرت و گرتـی بەنـاوچەوانییەوە و وتـی ئەمەم بەسـە، دەفەرمێـت: ئیتر ئەوە بـوو بینـیم خـوای گەورە بە کافری لە ناوی برد[١]، ئەویش ئومەیەی کوڕی خەڵەفە)

هەواڵی ئەم ڕووداوە وەها گەیشت بە کۆچکردووەکانی حەبەشە گوایە قورەیشییەکان موسڵمان بوونە، بۆیە ئەوانیش لە مانگی شەوالی هەمان ساڵ گەڕانەوە بۆ مەککە، بە دووری کاتژمێرە ڕێگایەک لە مەککەی پیرۆزەوە ڕاستی بابەتەکەیان زانی، دوای ئەوە کۆمەڵێکیان گەڕانەوە حەبەشە و کۆمەڵێ تریان گەڕانەوە بۆ مەککە بە نهێنی یان لە پاڵ پیاوێکی قورەیشی، یەکێک لەوانەی گەڕانەوە مەککە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود بوو.

[١] ژیانی پێغەمبەری خوا لەقورئان و فەرمووده صەحیحەکاندا.(محمد مەلا فایەق شارەزووری)

## کۆچی دووەم بۆ حەبەشە

بەڵا و نارەحەتی و چەوسانەوەکانی قورەیش بۆ سەر موسڵمانەکان زۆر سەختتر بوو، و میوانداریکردنی نەجاشییان بە لاوە گران بوو، و هەڵیاندەکووتاوە سەر موسڵمانان.

بۆیە پێغەمبەری سەرورمان ﷺ هیچ چارەیەکی تری نەبوو جگەلە ئەوەی ئاماژە بە کۆچێکی تری موسڵمانان بدات.

ئەم کۆچە زۆر لە کۆچی یەکەم سەختتر بوو، چونکە قورەیش بە ئاگا هاتبوو و بڕیاری ڕێگە گرتنی دابوو، بەڵام ئەمجارەش خوای گەورە ئاسانی کرد و موسڵمانان گەیشتنە لای نەجاشی بەر لەوەی قورەیشییەکان دەستیان پێ بگات.

لەبەر ئەوەی گومان لە بوونی عەممارِی کوڕی یاسر هەیە لەگەڵیان گەر ئەویش لەگەڵیان بوو بێت ئەوا ژمارەیان( ٨٣ )پیاو و( ١٨ )یان( ١٩ )ئافرەت بووە.

دوای ئەوەی قورەیشییەکان بە ئەم کۆچەی تری موسڵمانانیان زانی هەستان بە ناردنی نوێنەری خۆیان بۆ لای نەجاشی، بۆ ئەم مەبەستەش دوو پیاوی قسەزانیان هەڵبژارد ئەوانیش(عەمری کوڕی عاص و عەبدوڵلای کوڕی ئەبی ڕەبیعە) پێش ئەوەی موسڵمان بن، کۆمەڵێ دیاری بەنرخیانیش لەگەڵیان نارد بۆ نەجاشی و وەزیر و بەتریکەکانی.

کە گەیشتنە لای نەجاشی کۆمەڵێک قسە و باسی ناڕاستیان بە نەجاشی وت بۆ ئەوەی ڕازی بکەن و ئەویش موسڵمانەکانیان بۆ بگێڕێتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی

نەجاشی کەسێکی دادپەروەر بوو هیچ بڕیارێکی نەدا بە بێ ئەوەی گوێ لە موسڵمانەکانیش بگرێت.

بۆیە نەجاشی بانگی موسڵمانەکانی کرد و ئەوانیش ڕۆیشتن، نەجاشی پێیانی وت ئەم ئایینە چییە کە خۆتان پێی لە گەلەکەتان جیا کردووەتەوە و نە هاتوونەتە ناو ئایینی من و نە ئایینی هیچ میللەتێکی تر؟

جەعفەری کوڕی ئەبی طالب "خوای گەورە لێی ڕازی بێت" کە قسەکەری موسڵمانان بوو فەرمووی:-

ئەی پاشا، ئێمە خەڵکانێکی نەفام بووین، مردارەوەبوومان دەخوارد و بتمان دەپەرست و کردەوەی خراپمان دەکرد...هتد

هەتا خوای گەورە لە خۆمان پێغەمبەرێکی نارد، ئەو پێغەمبەرەی کە پێغەمبەر عیسا موژدەی هاتنی داوە و ناوی ئەحمەدە بەباشی نەژادی و خوڕەوشتی و داوێن پاکیمان ناسیوە بانگی کردین بۆ لای خوا کە بە تەنها بیپەرستین و واز لە ئاینی ئەفسانەی باوباپیرانمان بهێنین...هتد

جەعفەر "خوای گەورە لێی ڕازی بێت" بەردەوام بوو لە قسەکانی و کارە گرنگەکانی ئیسلامی بۆیان ڕوون کردەوە، و پاشان فەرمووی ئێمە ئەو پێغەمبەرەمان بەڕاست زانی و باوەڕمان پێی هێنا شوێنی کەوتین و بەم جۆرە خوای گەورەمان پەرست و هاوەڵمان بۆی دانەنا...هتد

بەڵام خزمانمان هەڵیان کوتایە سەرمان و ئازار و ئەشکەنجەیان داین...هتد

کاتێ زاڵبوون بەسەرماندا و ڕێگەیان لە چوونە ناو ئەو ئاینە لێ گرتین، ئێمەش بەرەو وڵاتی تۆ بەڕێ کەوتین و لە ناو هەموو وڵاتاندا وڵاتی تۆمان هەڵبژارد و پێمان

خۆشبوو ببینە دراوسێی تۆ و هیوامان وابوو کە بە هیچ شێوەیەک ستەممان لێ نەکرێت لەلای تۆ ئەی پاشا.

نەجاشی پێی وت: ئایە هیچ شتێکت لەبەرە لەوەی خودا بۆ پێغەمبەرەکەتان ناردویەتی؟

جەعفەر "خوای گەورە لێی ڕازی بێت" فەرمووی: بەڵێ.

نەجاشی پێی فەرموو: بیخوێنە.

جەعفەر سەرەتای سورەتی "مریم"ی بۆ خوێندەوە، نەجاشی ئەوەندە گریا هەتا هەموو ڕیشی تەڕ بوو، و بەتریکەکانی ئەوەندە گریان هەتا کتێبەکانی پێشیان تەڕ بوو.

پاشان نەجاشی فەرمووی: سوێند بێت ئەوەی ئەم و ئەوەی عیسا هێناویەتی لە یەک چاوگەوە هاتووە.

بە نوێنەرەکانی قورەیشی فەرموو بڕۆنەوە، سوێند بێت هەرگیز ئەمانەتان پێ نادەمەوە، ڕووی کردە "عەمری کوڕی عاص" و هاوەڵەکەی هەتا چوونە دەرەوە...

عەمر بە عەبدوڵڵای وت سوێند بە خوا سبەی وا دێمەوە دەبێت لە ڕەگەوە بیانکێشم، عەبدوڵڵا پێ وت شتی وا نەکەیت ئەوانە خزمن با جیاوازیش بن لەگەڵ ئێمە، بەڵام عەمر لەسەر قسەکەی سوور بوو، سبەی گەڕایەوە و بە نەجاشی وت: ئەی پاشا، ئەمانە شتی خراپ لە بارەی عیسای کوڕی مەریەمەوە دەڵێن، جا نەجاشی ناردی بە دوایانەوە پرسیاری عیسای لێیان کرد.

موسڵمانەکان ترسان، بەڵام بە یەک دەنگ بڕیاریاندا ڕاستگۆ بن.



کە ڕۆیشتنە لای نەجاشی و پرسیاری لێیان کرد، جەعفەر فەرمووی: ئەوە دەڵێین کە پێغەمبەرەکەمان ﷺ بۆمانی هێناوە، "عیسا" بەندە و پەیامبەری خوایە بە وشە و فرمانی خوای گەورە بووە، کە داوێتی بە "مریم"ی داوێن پاک.

ئنجا نەجاشی چیلکەیەکی هەڵگرت و وتی:

واللهی ئەو قسەیەی تۆ وتووتە سەبارەت بە عیسا هەر ئەوەندەیە.

بەتریکەکانی کەوتنە دەنگە دەنگە و قسە کردن، نەجاشی پێیانی فەرموو: واللهی ئەگەر دەنگە دەنگەیش بکەن هەروایە، ئنجا بە جەعفەر و هاوەڵاکانی وت:

ئێوە لە خاکی مندا لە سەلامەتیدان هەر کەس جوێنتان پێ بدات باجی لێ دەبرێت، سێ جار ئەم قسەیەی وتەوە، پێم خۆش نییە بە ئەندازەی شاخێک زێڕم هەبێت و ئازاری ئێوەی بدەم.

دواتر نەجاشی فەرمانی کرد هەموو دیارییەکان لەگەڵ نوێنەرەکان بگەڕێنرێنەوە بۆ قوڕەیشییەکان، و ئنجا فەرمووی: واللهی خوای گەورە بەرتیلی لە من وەرنەگرت کاتێک پاشایەتی بۆ من گێڕایەوە تا من بەرتیل وەربگرم، و خوای گەورە خەڵکانی بۆ من ملکەچ کردووە تا منیش ملکەچی ئەو بم.

و دوای ئەوە کۆمەڵێک خواردن و دیاری بە موسڵمانەکان بەخشی.

کۆچەرەکان تاکو ماوەیەک لە خۆشی و ئارامیدا، سُبْحَانَ الله پاش ئەو ماوەیە کەسێک پەیدا بوو بڕیاری جەنگیدا لەگەڵ نەجاشی، موسڵمانە کۆچەرەکان زۆر ترسان لەوەی کە نەجاشی ببەزێنرێت و کەسێکی تر ببێتە پاشا و ئەوان نەناسێت و بە پلە وپایەیان نەزانێت.

هاوەڵە کۆچکردووەکان ڕۆیشتنە لای نەجاشی و ئامادەبوونی خۆیان بە نەجاشی ڕاگەیاند کە ئامادەن لەگەڵی بجەنگن دژی ئەو کەسەی کە لەگەڵی دەجەنگێت، نەجاشی پێیانی فەرموو:

سەرکەوتنی خوای گەورە زۆر چاکترە لە سەرکەوتنی خەڵکی.

نەجاشی و سوپاکەی بەرەو ڕووباری نیل بەڕێکەوتن بۆ شەڕ کردن، و لە ئەو ماوەیەدا موسڵمانەکان نزایان دەکرد کە نەجاشی براوەی جەنگەکە بێت، خوای گەورە بە سەرکەوتنی نەجاشی کۆتایی بە جەنگەکە هێنا، و سەرتاسەری حەبەشە دیسانەوە گەڕایەوە ژێر دەستی نەجاشی، و موسڵمانە کۆچەرەکانیش لە باشترین شوێنی حەبەشە بوون تاکو گەڕانەوە لای پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ.

کۆچکردنی یەمەنییە ئەشعەرییەکان بۆ حەبەشە:-

ئەبو موسای ئەشعەری دەفەرموێت: کە هەواڵمان پێگەیشت خوای گەورە لە شاری مەککە پێغەمبەرێکی ناردووە، ئێمەش لە یەمەن بووین ویستمان کۆچ بکەین بۆ لای پێغەمبەرەکە ﷺ، و دوو برای بچووکم لەگەڵدا بوو یەکێکیان ناوی ئەبو بوردە بوو و ئەوی تریان ناوی ئەبو ڕەهم بوو لەگەڵ ٥٢ یان ٥٣ لە ئەشعەرییەکانی یەمەن.

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرمێت: پەنجا کەس لە ئەشعەرییەکان بووین لەگەڵ شەش کەس لە هۆزی عوکی یەمەن.

دەڵێت، سواری کەشتییەکە بووین بەڵام بەرەو نەجاشی حەبەشە بردمانی، و لەوێ پەیوەندیمان بە جەعفەر و هاوەڵکانییەوە کرد، و ئەویش پێمانی ڕاگەیاند و وتی: پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ خۆی ئێمەی ناردووە بۆ ئەم شوێنەیە و فرمانی



پێ کردووین لێرە بمێنینەوە، ئێوەش لەگەڵمان بمێننەوە تا ئەو کاتەی پێغەمبەر ﷺ ڕێگە دەدات.

ئێمەش لەگەڵیان ماینەوە تا ئەو کاتەی هەمووومان وەکو دوا کۆمەڵەی کۆچەران گەڕاینەوە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لە شاری مەدینە کاتێک قەڵای خەیبەر ڕزگار کرابوو.

سەرەڕای ئەو هەموو ئەشکەنجەدان و بوختان کردن و پڕوپاگاندانە الحمدللە ژمارەی موسڵمانان هەر لە زیادبوون بوو، و بە بوختان و پڕوپاگەندەی قوڕەیشییەکان هەڵناخەڵەتان.

قوڕەیشییەکان کە زانیان هیچ سوودی نییە لەگەڵ نەجاشی بۆیە بیریان کردەوە کە پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ ڕابگرن یان بیکوژن، بەڵام بە ئاسانی بۆیان ناکرا چونکە خوای گەورە "ئەبو طالب"ی مامی کردبووە هۆکارێک بۆ پاراستنی و ئەویش ڕێگای نادا هیچی لێ بکەن.

دواتر بیریان کردەوە کە لەگەڵ "ئەبو طالب" قسە بکەن.

بۆ ئەم مەبەستەش چەند گەورە پیاوێکی قوڕەیش ڕۆیشتنە لای "ئەبو طالب" و کۆمەڵێ قسەیان پێی وت و هەڕەشەیاندا لە خۆی و لە پێغەمبەری سەروەرمانﷺ.

جا "ئەبو طالب " ئەو هەڕەشانەی قوڕەیشی لا گەورە بوو، بۆیە بانگی پێغەمبەری ئەزیزمانی کرد ﷺ، پێی وت: ئەرێ برازاکەم، خزمەکانت هاتنە لام و ئاوها و ئاوهایان پێم وت، منیش و خۆشت بهێڵە و کارێکم پێ مەکە پێم هەڵنەگیرێت.

پێغەمبەری سەروەرمانﷺ وایزانی مامی پشتی تێکردووە و لە لاوازیدا پشتی ئەوی پێ ناگیرێت، و فەرمووی: مامەکەم، سوێند بە خوا گەر لەسەر دەستی ڕاستم

خـۆر و لەسـەر دەسـتی چەپـم مانـگ دابنـێن و لە بەرامـبەر ئەوە واز لە ئەم کـارە بهێنم، ئەوە هەرگیز دەستبەرداری نابم، هەتا خـوای گەورە سـەری دەخـات یان لە پێناویدا دەڕۆم.

پاشـان گریا و ڕۆیشـت، ئەبو طالب بانگی کرد، کە بانگی کـرد پێی وت: برازاکەم بڕۆ حەزت لە چییە بیڵێ، سـوێند بە خـوا ناتـدەم بە دەسـت کەسـەوە و ئەم شیعرەشی پێی وت:

وَاللَهِ لَن يَصِلوا إِلَيكَ بِجَمعِهِم

حَتّى أُوَسَّدَ في التُرابِ دَفينا...

کاتێک قـوڕەیش بینیـان پێغەمبەری نازدارمان ﷺ بەردەوامە لەسـەر بانگەوازەکەی و ئەبو طالب پشتی بەرنادات، دووبارە ڕۆیشتنەوە لای و "عەممارەی کوڕی وەلیدی کـوڕی مـوغیرە"یـان بـرد و پێیـان وت: ئەم کـوڕە پێکەوتـووترین و جـوانترین کـوڕی قوڕەیشـە بیبـە بـۆ خـۆت و لەلای خـۆت ڕایبگـرە و بـیکە کوڕی خـۆت و بـرازاکەی خۆتمـان بـدە دەسـت چـونکە دژی ئـایینی تـۆ و ئـایینەکەی باوبـاپیرانی تـۆیە، و یەکدەنگی خێڵەکەتی شێواندووە و بە بێ عەقڵیان دەزانێت، و ئێمەش دەیکوژین، و بەو شـێوەیە دەبێـتە پیاوێـک بە پیاوێـک، ئەبـو طالـب وتـی: ئـای چی سـەودایەکی خـراپم لەگەڵ دەکەن، کوڕەکەتـانم پـێ دەدەن بـۆ ئەوەی بە خێـوی بـکەم بۆتـان، منیش کوڕەکەمتان پێ بدەم بۆ ئەوەی بیکوژن!

سوێند بەخوا هەرگیز شتی وا نابێت.

بەردەوام بوون لە قسە کردن و لە کۆتاییدا ئەبو طالب پێیانی وت هەرگیز دەستبەرداری پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ نابێت و چییان لە دەست دێت با بیکەن.



دوای شکستهێنانی هەوڵی دوو شاندەکەی قورەیش بۆ لای "ئەبو طالب" قورەیشییەکان ئەشکەنجە و ئازاردانەکانیان بۆ سەر پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ و موسڵمانان زۆر سەختتر کرد لە پێشوو، و بیرۆکەی ئەوەیان دانا کە پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ لەناو بەرن بەڵام ئەم هەوڵەیان بووە هۆی بەهێزتر کردنی ئیسلام بە موسڵمان بوونی "حەمزەی کوڕی عەبدولموطەلب" و "عومەری کوڕی خەطاب".

لەو ماوەیەدا چەندین جار بە توندی ئازاری پێغەمبەری نازدارمانیان دا ﷺ و هەوڵی کوشتنیان دا، لە نموونەی ئەو ئازارانە جارێکیان کەسێک لە قورەیش بە ناوی "عوتیبەی کوڕی ئەبی لەهەب" کە زاوای پێغەمبەری ئەزیزمانیش بوو ﷺ، ڕۆژێک هەڵدەکوتێتە سەر پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ و ئازاری دەدات و بە سەروەری خۆشەویستیشمان ڕادەگەیەنێت کە لە "ئوم کەلثوم"ی کچی جیا بووەوە، پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ هەر لە ئەو کاتەدا داوا لە خوای گەورە دەکات سەگێک لە سەگەکانی تێ بەردات، جارێکیان لە شام دەبن سُبْحَانَ اللّٰه شەوێکیان شێرێکیان لێ پەیدا دەبێت و ئەویش دەڵێت ماڵ وێران خۆم واللّٰەی ئەو شێرە ئێستا من دەخوات، هەروەک چۆن محمد نزای لێم کرد، کوشتمی لە کاتێک ئەو لە مەککەیە و من لە شام، لە ئەو کاتەدا شێرەکە پەلاماری دەدات و سەری لێ دەکاتەوە.

و جارێکیان "ئەبو جەهل" دەڵێت پەیمان دەدەم بە خوا بە بەردێکەوە بۆ محمد دادەنیشم و لەگەڵ سوجدە بردنیدا دەیدەم بەسەریدا، کە ڕۆژ بووەوە ئەبو جەهل هەروەکو وتی بە بەردێکەوە دانیشت و چاوەڕێی پێغەمبەری ڕابەرمانی

دەکرد ﷺ، کە پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ وەکو هەموو کات لە بەرەبەیان هات بۆ نوێژ کردن، کە سوجدەی برد ئەبو جەهل بەردەکەی هەڵگرت و هەرکە لێی نزیک بووەوە سەری شۆڕ کرد و بە زەرد هەڵگەڕاویی گەڕایەوە و دەستی ڕەق بوو هەتاکو بەردەکەی لە دەست بەربووەوە، چەند پیاوێک لە قورەیشییەکان ڕۆیشتنە لای و لێیان پرسی ئەی ئەبا حەکەم ئەوە چیتە؟

وتی هەستام ئەوە بکەم کە دوێنێ بە ئێوەم وت، کە لێی نزیک بوومەوە نێرە وشترێکی گەورە بەری ڕێگەی لێ گرتم، تا ئێستا شتی وەک ئەوە گەردن بەرزم نەبینیبوو، وێنەی ئەو قەد و کەڵبە و دەم و ددانەم بەرچاو نەکەوتبوو، خەریک بوو بمخوات.

"ئیبن ئیسحاق" دەڵێت پێغەمبەر ﷺ بۆمی باس کرد و فەرمووی ئەوە جبریل(سەلامی خوای گەورەی لێ بێت) بوو، گەر نزیکتر ببووایەوە دەیبرد.



## هەوڵدانی قوڕەیش بۆ ڕێککەوتن لەگەڵ پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ:-

دوای موسڵمان بوونی دوو لە پاڵەوانە بەڕێزەکانی ئیسلام "حەمزەی کوڕی عەبدولموطەلب" و "عومەری کوڕی خەطاب" موسڵمانەکان بەهێزبوونێکی بەرچاویان لێ بەدی کرا، و بێباوەڕەکان ترسێکی باشیان لێ نیشت، بۆیە یەکێک لە قسەزان و پیاو ماقوڵەکانی قوڕەیش بە ناوی "عوتبەی کوڕی ڕەبیعە" بە قوڕەیشییەکانی وت بۆ نەڕۆم بۆ لای محمد قسەی لەگەڵ بکەم؟

لە ئەم کاتەدا پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ لە مزگەوت دانیشتبوو.

عوتبە وتی دەڕۆم هەندێک پێشنیار دەخەمە پێش دەستی لەوانەیە بە هەندێکیان ڕازی بێت، و چی ویست پێی دەدەین و وازمان لێ بێنێت؟

ئەوانیش بیرۆکەکەیان بە دڵ بوو.

عوتبە ڕۆیشتە لای پێغەمبەری ڕابەرمان ﷺ کە بە تەنها لە مزگەوت دانیشتبوو، بە جوانی و بەڕێزەوە قسەی لەگەڵ پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ کرد، بەردەوام بوو لە قسە کردن و وتی گوێبگرە کۆمەڵێ کاروبار دەخەمە بەر دەستت بیری لێبکەوە، لەوانەیە هەندێکیان وەربگریت.

پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ پێی فەرموو: ئەبو وەلید هەرچییەکت هەیە بیڵێ، گوێم لێتە.

عوتبە وتی: برازا ئەو شتەی کە هێناوتە گەر ماڵت پێی دەوێت، هەموومان ماڵ و سامانی خۆمانت بۆ کۆ دەکەینەوە تاکو دەبیتە دەوڵەمەندترین کەسمان، گەر گەورەییت دەوێت دەتکەینە گەورەی خۆمان و بەبێ تۆ هیچ شتێک ناکەین، گەر پاشایەتیت دەوێت دەتکەینە پاشا، و ئەگەر ئەوەش بۆت دێت ڕێیەکە ناتوانیت لە

خۆت دووری بخەیتەوە ئەوا ئێمە حەکیمێکت بۆ دێنین، و هەرچی ماڵ و سامانی خۆمان هەیە خەرجی دەکەین تاکو چاک دەبیتەوە، عوتبە بەردەوام بوو لە قسەکانی و پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ بە تەواوی گوێی لێ گرتبوو، و پێی فەرموو:

ئەبو وەلید تەواو بوویت.

وتی: بەڵێ.

سەروەرمان ﷺ پێی فەرموو:

تۆش گوێ لە من بگرە.

وتی: باشە.

پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ فەرمووی:

**بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ حمٓ ۝ تَنْزِيلٌ مِنَ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ۝ كِتَابٌ فُصِّلَتْ آيَاتُهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ۝ بَشِيرًا وَنَذِيرًا فَأَعْرَضَ أَكْثَرُهُمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ۝**

بە (حا، میم) دەخوێنرێتەوە خوا زاناترە بە واتای، سەیری سەرەتای سورەتی (البقرة) ش بکە ❁ قورئان لەلایەن خوای بەخشندەی میهرەبانەوە نێردراوەتە خوارەوە ❁ پەڕاوێکە بەڵگەکانی ڕوون کراوەتەوە (لێك جیاکراوەتەوە) قورئانێکە بە زمانی عەرەبی بۆ گەلێك کە شارەزان و دەزانن ❁ مژدەدەرو ترسێنەرە کەچی زۆربەیان گوێ ی پێ نادەن و بۆیە (قورئان) نابیستن.

پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ بەردەوام بوو تاکو گەیشتە سەجدەکە و سەجدەی برد، و عوتبەیش لەو ماوەیەدا دەستی خستبووە پشتی و خۆی دابوو بەسەری و گوێی دەگرت.



دواتر فەرمووی ئەبو وەلید ئەوە تۆ و ئەو، ئەویش هەستا و ڕۆیشت بۆ لای قوڕەیشییەکان، هەندێکیان وتیان سوێند بە خوا ئەو ڕەنگ و ڕووەی هەیەتی ئەوە نەبوو کە پێی ڕۆیشت.

کە هاتەوە لەلایان دانیشت، وتیان ئەوە چیتە ئەبو وەلید؟

وتی: سوێند بە خوا من گوێم لە قسەیەک بوو هەرگیز گوێم لەو جۆرەم گوێ لێ نەبووە، واللهی ئەوە نە شیعرە نە جادووە....هتد

بەردەوام بوو لە قسەکانی و قوڕەیشییەکان پێیان وت: واللهی ئەبو وەلید دەڵێی بە زمانی جادووی لە تۆش کردووە.

عوتبە وتی: ئەوە ڕای منە دەربارەی ئەو پیاوە، چیتان پێ باشە ئەوە بکەن.

## دابڕان وگەمارۆدانی بەنی هاشم لەدۆڵی ئەبوطالب دا لەلایەن قوڕەیشەوە:

قوڕەیش دوای ئەوەی شکستی هێنا لە هەموو مەیدانی بەگژداچوونەوە وە ڕووبەڕووبوونەوەی پێغەمبەرﷺ و ئاینەکەی لەگەڵ دژایەتی کردنی توندی هاوەڵەکانی، دوای شکست خواردنەکەی لە حەبەشە و بوونی حەبەشە بە پێگەو پەنای پێغەمبەر ﷺ و نیشتەجێ بوونی هەندێک لە یارانی، وە بەرگری لێکردنی نەجاشیش لەوان، ئا لەم کاتەدا قوڕەیشیەکان کۆبوونەوە بۆ ئەوەی کۆنە قین و زوخاوی خۆیان بڕێژن بە پێغەمبەر ﷺ و بیکوژن، بەڵام کوڕانی بەنی هاشم و بەنی مطلب (تەنها بەنی نەوفەل نەبێت) کە خزمانی پێغەمبەر ﷺ بوون وە تەنها هەر ئەو لایەنانە بەرگریان لە پێغەمبەر ﷺ دەکرد بۆیە قوڕەیش گوشارو گەمارۆی توندی خستنە سەریان تا پێغەمبەر ﷺ تەسلیم بکرێت و لەسێدارە بدرێت، لە شوێنێکدا کۆبوونەوە کە پێغەمبەر ﷺئاماژەی پێکرد.

ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازیبێ دەفەرموێت:(پێغەمبەر ﷺ بۆ سبەینێ کە ڕۆژی نەحر بوو لە مینا فەرمووی: (ئێمە بەیانی لادەدەینە خێڵی کوڕانی بەنوکینانە کە هەموویان کۆبوون لەسەر کوفر)ئەمەش دەست نیشان کردنی ئەو شوێنەیە کە ئەوان کۆبوونەوە و بڕیاری گەمارۆی ئابووری و جەنگی دەروونی دابڕان و گۆشەگیرکردنی پێغەمبەر ﷺ و خزمانی لە بەنی هاشم و یاوەرەکانیاندا تا پێغەمبەریان ڕادەست بکرێت).

ئەم بەسەر هاتەش زانای پایە بەرز ئیبنو ئیسحاق ڕەحمەتی خوای لێبێ بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (قوڕەیش کاتێک بینی هاوەڵانێ پێغەمبەر ﷺ چونەتە



وڵاتی کە بەرگریان لێ دەکات، ئیمامی عومەریش ڕەزای خوای لێبێ موسوڵمان بووە لەگەڵ هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، وە ئاینی ئیسلامیش بەرەبەرە بڵاوبۆتەوە بە هەموو هۆزو لایەنەکانی قوڕەیش دا ئینجا کۆبوونەوە و پلانیان گێڕاو ڕێکەوتنامەیەکیان ئەنجامدا و لە کاغەزێکدا نوسیان، ئەوان ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی کە دژ بەبەنی هاشم و بەنی مطلب بن و ژنیان لێ نەخوازن و ژنیان پێ نەدەن وە بەهیچ جۆرێک شتیان پێ نەفرۆشن وە هیچیان لێ نەکڕن. کاتێ لەسەر ئەم بڕیارە کۆبوونەوە نووسیان و بڕیارنامەکەیان لەناو کەعبەدا هەڵواسی و پەیمانیان لەیەکتر وەرگرت کە هەموویان بڕگەکانی ئەو پەیمانە بەوردی جێ بەجێ بکەن پاشان بەنی هاشم و بەنی مطلب کۆبوونەوە لای ئەبو طالب مامی پێغەمبەر ﷺ وە هەموویان پشگیریان لە پێغەمبەر ﷺ کرد وە هەموو چونە ناو دۆڵەکەوە کە بەدۆڵی ئەبو طالب بەناوبانگە وە کۆبوونەوە لەوێ تەنها ئەبو لەهەبی خیانەتکار نەبێت ئەو دژ بە پێغەمبەر ﷺ بوو وە بووە لایەنگری قوڕەیش دژ بە پێغەمبەر ﷺ و خزمانی). سەرەتای چوونە ناو شیوەکە لەمانگی موحەڕەمی ساڵی حەوتی پێغەمبەرایەتی بوو وە لە ساڵی دەی پێغەمبەرایەتی دا کۆتای بەم گەمارۆیە هات.

موسای کوڕی عوقبە خوا لێی ڕازیبێ بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت:موشریکەکان زۆر سەخت گیرانە دەوەستان بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانان تاوەکو فشاریان خستنە سەر و نارەحەتیان کردن و بەڵایان لەسەر گەورە کردن قوڕەیش لە پلانەکانیاندا کۆبونەوە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بە ئاشکرا بکوژن. کاتێ ئەبو طالب بینی کە قوڕەیش نیازو مەرامی چییە کوڕانی بەنی مطلبی

کۆکردەوە و فەرمانی پێکردن کە پێغەمبەر ﷺ بگرنە خۆیان و لە دۆڵەکەی خۆیان پارێزگاری بکەن لەولایەنانەی کە بەگژیدا دەچن ودەیانەوێت بیکوژن.

بەو شێوەیەش سەرجەم کوڕانی بەنی هاشم و بەنی مطلب بە موسڵمان و کافریانەوە پشتگیریان لە پێغەمبەر ﷺ کرد، بێ بڕواکانیان لە غیرەت و دەمارگیری عەشایری، وە موسوڵمانەکانیان لە باوەڕ و ئیمانی خۆیانەوە، قورەیش زانی کە ئەو دوو لایەنە هەرگیز خۆیان تەسلیم ناکەن کۆبوونەوە لەسەر ئەوەی کە بەهیچ جۆرێک دانەنیشت لەگەڵیان دا و هیچیان پێ نەفرۆشن وە سەردانیشیان ناکەن لە ماڵەکانیاندا، تا پێغەمبەر ﷺ تەسلیم دەکەن بۆ کوشتن.

سەبارەت بەو پلانەشیان ڕێکەوتنێکیان ئەنجام دا و نوسیانەوە لە کاغەزێکدا پەیمانیان وەرگرتبوو لە یەکتر کە بەهیچ جۆرێک هیچ ڕێکەوتنێک لەگەڵ بەنی هاشم دا نەکەن وە پێی ڕازی نەبن ، وە بەهیچ جۆرێک نەرم و نیان نەبن بەرامبەریان تا پێغەمبەر ﷺ تەسلیم دەکەن و ڕازی دەبن بە کوشتنی ، بەنی هاشم و بەنی مطلب لە دۆڵەکەیاندا سێ ساڵ مانەوە بەڵام نارەحەتی و برسیەتیەکی زۆر سەختەو ناهەموار دوچاریان بوو.ئەوە بوو کاتێک بەبازاڕدا دەگەڕان و دەیان بینی هیچ خواردنێک نەماوە کە ئەوان بیکڕن وە هەرشتێک بهاتایە ناو مەککە قورەیش دەست پێشخەریان دەکرد بۆ کڕینی بۆ ئەوەی دەست ئەوان نەکەوێ، ئەم هەمو هەوڵەشیان تەنها لەبەر ئەوەبوو کە خوێنی پێغەمبەر ﷺ بڕێژن.

ئەبو طاڵب کاتێک کە خەڵک دەچوونە سەرجێگاو نووستن فەرمانی دەکرد کە پێغەمبەر ﷺ بچێتە سەر جێگاکەی خۆی بخەوێ بۆ ئەوەی ئەوانەی کە دەیانەوێ زەفەری پێ بێنن ، بزانن پێغەمبەر ﷺ لە جێگەی خۆی خەوتووە، وەدواجار



فەرمانی دەکرد یەکێک بچێتە سەر جێگاکەی پێغەمبەر ﷺ بخەوێت، وە پێغەمبەریش ﷺ بچێتە جێگایەک لە جێگاکانی خزمانی خۆی و لەوێ بخەوێ بۆ ئەوەی کە سەلامەت بێ.

کاتێ کە سەری ساڵی سێیەم هات هەندێ لە پیاوانی بەنی عەبد مەناف کە خزمایەتیان وەکو خزمایەتی بەنی مطلبە بۆ بەنی هاشم کەوتنە لۆمەکردنی یەکتر، ئەوانی کوڕانی بەنی قوسەی و هەندێ لە پیاوانی قورەیش کە دایکانیان لەبەنی هاشم بوو بۆیان ڕون ببوەوە سێ ساڵە ئەم ڕەفتارەیان زۆر نامەردانە و ناجوامێرانەیە، کەدەیکەن بەرامبەر بەنی هاشمی خزمانی خۆیان، و پەیوەندی خزمایەتیان دەپچڕێنن و سوکایەتی بە حەقیان دەکەن، بۆیە کۆبوونەوە لە شەوێکدا و بڕیاریاندا لە ناو خۆیاندا کە ئەو ڕێکەوت نامەیە هەڵوەشێننەوە کە غەدر و خراپەکاری تێدایە بەرامبەر ئەو دوولایەنەوە بێ بەری بوونی خۆیانی لێ ئاشکرا بکەن، ئەوەبوو خوای گەورە مۆرانەی ناردە سەر ئەو کاغەزە و هەرچی ناوی خوا هەبوو بە کاغەزەکەوە نەیهێشت و سڕیەوە تەنها زوڵم و غەدر نەبێت. (لەڕیوایەتێکی تردا:تەنها ناوی خوا مابوەوە ئەوی تری سڕابوەوە)بەڵام ڕایوایەتەکەی (موسای کوڕی عوقبە ڕەزای خوای لێبێ ڕاسترە(کە تەنها ناوی خوا سڕابوەوە ئەوانی تر مابوون)دەفەرموێت:هەمووی سڕابوەوە تەنها ئەو ستەم کاریانەو پەیوەندی خزمایەتی پچران نەبێت کە تیایدا مابوەوە ، خوای گەورە ئەم هەواڵە گەیاند بە پێغەمبە ﷺ کەچی کردووە لە ڕێکەوت نامەکەیان، پێغەمبەریش ﷺ ئەمەی گێڕایەوە بۆ ئەبو طالب.

ئەبو طالبیش وتی: سوێند بە ئەستێرە کونتێکراوەکان محمد قەت درۆی نەکردووە لەگەڵمدا، ئینجا لەگەڵ کۆمەڵێکدا ڕۆشت تا چوونە لای کەعبە و ئەو ڕۆژە زۆرێک لە قوڕەیشیەکانی لێبوو کە بینیان ئەبوطالب هاتووە ئەوانیش بە لوتبەرزیەکەوە تەماشایان کرد وایانزانی هاتووە بۆ ئەوەی پێغەمبەریان ﷺ تەسلیم بکات، وایانزانی ئەمانە نارەحەتی گوشاری گەمارۆکە وای لێکردوون کە ناچاربن بەتەسلیم کردنەوەی پێغەمبەرﷺ.

ئەبوطالب هات وتی :چەند شتێک ڕویداوە لە نێوان ئێمە و ئێوەدا پێویست ناکا باسبکرێت، بەڵام ئێوە ئەو بڕیارەی کە نوسیوتانە و پەیمانتان لەسەری داوەو بیهێنن بەڵکو لەسەر ئەو پەیمانە ڕێکەوت نامەیەک لەنێوان ئێمە و ئێوەدا ببێت، ئەمەش بۆ ئەوەبوو نەوەک کاغەزەکە بکەنەوە تابزانن چی تیا کراوەو چی تیا نەکراوە، بۆیە داوای لێکردن نامەکەی بۆ بهێنن لەنێوان ئەمان و ئەواندا، وە ئەوان هیچ گومانێکیان لەوەدا نەبوو کە پێغەمبەر ﷺ تەسلیمیان دەکرێتەوە، وە قوڕەیشیەکان نامەکەیان هێنا لە نێوان خۆیان و ئەبو طالبدا دایان ناو بە ئەبوطاڵب یان وت:ئێستا کاتی ئەوە هاتووە ڕازی بن و بگەڕێنەوە بۆ لای خزمان و هۆزانی خۆتان و ببنەوە بە یەک و پێک بێن، خۆتان دەزانن تەنها یەک پیاو بۆتە هۆی پچراندنی خزمایەتی نێوان ئێمەو ئێوە کە ئەوە بووە بەهۆی لەناوچوون و ئەو هەموو زیانەی گەیشتووە بە ئێوەی بەنی طالب و بەنی هاشم ، ئەبوطالب لەوڵامدا وتی: من هاتووم بۆ لای ئێوە تا شتێکتان پێ بدەم کە دادپەروەرتر بێت لە نێوان ئێمە و ئێوەدا، برازاکەم هەرگیز درۆی لەگەڵ نەکردووم پێی ڕاگەیاندم کە خوای گەورە بەریەو دورە لەوەی لەناو ئەو ڕێکەوت نامەیەیی ئێوەدا هاتووە و



لەژێر دەستاندایە، بۆیە هەرناوێک لەناوەکانی خوای تێدا هەبوبێت سڕاوەتەوە تەنها غەدرو خزمایەتی پچراندن و دژایەتی کردن و ستەم کردنی ئێوە نەبێت هیچی تێدا نەهێشتۆتەوە ئەگەر ئەو هەواڵەی کە برازاکەم پێی وتم ڕاست بێت ئێوە هۆشتان بەخۆتانا بێتەوە، وەڵاهی تەسلیمتان ناکەین گەر هەمووومان لەناو چووبین، وە ئەگەر ئەوەی وتویەتی ڕاست نەبێت مەرج بێت تەسلیمتان دەکەینەوە یان بیکوژن یان بیهێڵنەوە.قوڕەیشیەکان وتیان:ڕازین بەوەی کە دەیڵێیت ئینجا لە پێش چاوی هەمویاندا کردیانەوە بینیان هەواڵەکە بەو شێوەیە کە پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندبوو، کە قوڕەیش ئەوەیان بینی و هەڵوێستی ئەبوطالب یان تەماشاکردوو وتیان:وەڵاهی ئائەمە سیحرەو لەلایەن محمدەکەی ئێوەوە کراوە بەرامبەر ئەو کاغەزەو هیچ شتێکی تر نیەو کینەیان ئەستور بوو سەبارەت بە دژایەتی کردنی پێغەمبەر ﷺ و دژایەتی کردنی هاوەڵانی ، لەو کاتەدا هەندێ لە کوڕانی بەنی طاڵب وتیان:درۆزن و سیحر بازی شایستەی ئێمە نییە بەڵکو پیشەی ئێوەیە کە کۆبوونەتەوە دژ بە ئێمە و کۆبوونەوەتان دژ بە ئێمە نزیکترە لە سیحر و جادوگەری ئەگەر سیحر نەبێت ئێوە چۆن ماوەیەکی زۆر دژ بە ئێمە دەبن هەتا خوای گەورە ناوی خۆی سڕییەوە لەو ڕێکەوت نامەیەدا تەنها ملهۆڕییەکەی ئێوە نەبێت هیچی تری تیا نەماوەتەوە ، ئایە ئێمە سحر بازین یان ئێوە؟ ئا لەوکاتدا هەندێ لە کوڕانی بەنی عەبد مەناف و هەندێ لە کوڕانی بەنی قوسەی و هەندێ لە قوڕەیشیەکان کە دایکیان لە بەنی هاشم بوو لەوانە :ئەبولبوختەری مطعم ی کوڕی عەدی وزوهەیری کوڕی ئومەیە و زەمعەی کوڕی ئەسوەند وە هاشمی کوڕی عەمر کەنامەکەی لابوو لەپێش چاوی قوڕەیشییەکان وتیان:ئێمە بەرین لەوەی

لەم ڕێکەوتن نامەیەدا هاتووە و بەهیچ جۆرێک پەیوەندی بە ئێمەوە نەماوە، ئەبوجەهل وتی:ئائەمە پیلانێکە بەشەو نەخشەی بۆ دانراوەوە ڕێککەوتون لەسەری.

ئەوە بوو هەڵوێستی ئەم پیاوانە بوو بەهۆی شکاندنی گەمارۆکە، ئینجا ئەبوطالب یش دەستی کرد بەهۆنینەوەی شیعرەکانی سەبارەت بە وەسفی پێغەمبەر ﷺ و باسکردنی ئەو زوڵم و ستەمانەی کراوە بەرامبەر بەنی هاشم و بەنی مطلب بۆ ماوەێ سێ ساڵ وە ستاشی ئەو کەسانەی دەکرد کە هەوڵیان داوە بۆ شکاندن و پووچ کردنی ئەو ڕێکەوتنامەیە.

وە هەر ئەوەش بوو کە پێغەمبەر ﷺ پێزانینی خۆی دەربڕی بۆ کوڕانی بەنی هاشم وبەنی مطلب وە بەیەک چاو سەیری دەکردن جگە لە :بەنی نەوفەل و بەنی عەبدمەنافی کوڕی بەنی نەوفەل(ئەوەبوو کاتێ دەستکەوتەکانی خەیبەری هاتە دەست بەشی خۆی دابەش کرد بەسەر کوڕانی بەنی هاشم و بەنی موطلب دا کاتێک بەنی نەوفل بەمەیان زانی وتیان :ئەی پێغەمبەر ﷺ بۆ بەشی بەنی مطلبت داوە و بەشی ئێمەت نەداوە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی:(انما بنو هاشم و بنو عبدالمطلب شئ واحد انهم لم يفارقوني في الجاهلية و لا في الأسلام) واتە:بەنو هاشم و بەنو موطلب یەکشتن ئەوانە لێمان جیانەبوونەتەوە نەلەکاتی جاهلیدا وە نەلەکاتی ئیسلامیشدا(واتە: لەهەردوو کاتەکەدا پشتی پێغەمبەر ﷺ یان گرتووە و پارێزگاریان لێ کردووە).[1]

---

[1] ژیـــــانی پێغەمـــــــبەری خـــــــوا ﷺ لە قورئـــــــان و فەرموودەکانـــــــدا نوسینی:محمد ملا فائق شارەزووری

## هەڵگرتنی ئابلۆقەو دڕاندنی پەیماننامە

ماوەی ئەو ئابلۆقەیەو درێژیی کاتە پڕ لە ناسۆرییەکانیشی گەلێک مەینەتیو ئێشو ئازاری بەسەر ئابلۆقەدراواندا هێناو تا کار گەیشتە ئەوەی نەختێک سۆزو بەزەیی بکەوێتە دڵی چەند گەورەپیاوێکی (قورەیش)ەوەو پێنج کەس لە گەورەپیاوانیان داوایان کرد چیدی کار بەو بڕیارنامەیە نەکرێت هەرچەندە کە هێشتا بەرهەڵستییەکی توندیش لەسەر داواکەیان هەبوو، ئینجا یەک لەو پیاوانە کەناوی (مطعم بن عدي) بوو چوو پەیماننامەکەی دەرهێنا بۆ ئەوەی بیدڕێنێ، کە تەماشای کرد مۆرانە هەمووی خواردبوو، جگە لە وتەی (باسمك أللّهم) واتە: بەناوی تۆ ئەی خوایە! (عەرەبەکان بەم وشەیە دەستیان بە شت نووسین دەکرد).

بەم کارە جوامێرییەی ئەو پێنج کەسە، پەیماننامەکە هەڵوەشێنرایەوەو پێغەمبەرو (ﷺ) ئەوانەی لەگەڵی بوون لە شیوی (أبو طالب) هاتنەدەرێو گەڕانەوە بۆ (مەککە)، بەڵام (قورەیش) دەستی لە دوژمنایەتی پێغەمبەرو (ﷺ) هاوەڵانی هەڵنەگرت.

## ڕۆیشتنی کۆتا شاند بۆ لای ئەبو طاڵیب پێش مردنی:-

سەروەری خۆشەویستمان ﷺ لە شێوەکە هاتە دەرەوە و دەستی کردەوە بە کارەکەی، هەرچەندە قورەیشییەکان وازیان لە دابڕینەکان هێنابوو بەڵام هەر بەردەوامبوون لە ئەشکەنجەدانی موسڵمانان و ڕێگری کردن لە ڕێبازی خوای گەورە.

و ئەبو طاڵیبیش بەردەوام بوو لە پاراستنی پێغەمبەرمان ﷺ، ئەو کات تەمەنی لە هەشتا ساڵ تێپەڕیبوو و نەخۆشی ڕووی تێکردبوو و جومگەکانی بێهێز و لاواز بوون بەهۆی ئەشکەنجەدان و ئازار و ئابڵوقەی ئەو ماوەیەی کە لە شێوەکە مابوونەوە.

قورەیشییەکان بیریان کردەوە گەر دوای مردنی ئەبو طاڵیب شتێک لە پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ شکۆ و شورەتیان لە نێو عەرەب لە دەست دەدەن، بۆیە ڕێککەوتن شاندێک بە ئامادەبوونی ئەبی طاڵیب بنێرن بۆ لای پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ و قسەی لەگەڵ بکەن، و کە کۆتا شاند بوو بینێرنە لای ئەزیزمان  ﷺ.

شاندەکە کۆمەڵێک لە پیاو ماقوڵانی قورەیش بوون و ڕۆیشتن بۆ لای ئەبو طاڵیب کە پێکهاتبوون لە عوتبەی کوڕی ڕەبیعە و شیبەی کوڕی ڕەبیعە و ئەبو



جەهلی کوڕی هشام و ئومەیەی کوڕی خەڵەف و ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب لەگەڵ چەند پیاو ماقوڵێکی تردا کە نزیکەی ٢٥ کەس دەبوون.

وتیان ئەبو طاڵیب خۆت دەزانیت چی پلەوپایەیەکت هەیە لە نێوانمان و دەبینیت خۆت چیت لێبەسەرهاتووە، دەترسین شتێکت لێ بێت و دەزانیت کێ لە نێوان ئێمە و برازاکەتدایە، بانگی بکە چی لەلای ئێمەیە بیگێڕەوە بۆی و چی مافێکی ئێمە لەلای ئەوە بۆمان وەرگرە، و با وازمان لێ بهێنێت و ئێمەش وازی لێدەهێنیت،و واز لە ئایینەکەمان بهێنێت و ئێمەش واز لە ئایینەکەی دێنین.

ئەبو طاڵیب ناردی بە شوێن پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ، ئەویش هاتە لایان و پێی وت:- برازاکەم ئەمە پیاو ماقوڵانی خێڵەکەتن، لەبەر تۆ کۆبوونەتەوە تا هەق و حیساب لەگەڵ یەکتر بکەن، پاشان هەواڵی پێدان کە بۆ چی هاتوون، لەگەڵ دەستنەهێنانە ڕێگای هیچ لایەک بۆ لایەکەی تر.

پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ پێیان فەرموو:- پێتان چۆنە قسەیەکتان پێبدەم باسی بکەن، بەو قسەیە ببنە خاوەنی عەرەب و عەجەمیش ملتان بۆ دەدەن.

کە ئەوەی فەرموو، هەموویان وەستان و سەرسام بوون نەیاندەزانی چۆن ئەو قسە بەسوودە ڕەتبکەنەوە، پاشان ئەبو جەهل وتی ئەو وشەیە چییە؟ بەسەری باوکت دە وشەیشت پێ دەدەین.



فەرمووی بڵێن"لا إله إلا الله" و واز لەو شتانە بێنن وا دەیپەرستن.

دەستیان کرد بە چەپڵە لێدان و وتیان ئەی محمد تۆ دەتەوێ هەموو خواوەندەکان بکەیت بە یەک خواوەند

بەڕاستی تۆ شتی سەیر دەڵێیت.

پاشان هەندێکیان بە یەکتریان دەوت:

سوێند بە خوا ئەو پیاوە هیچ شتێکتان ناداتێ لەوەی کە داوای دەکەن، بڕۆن بە دەم ئاینی باوباپیرانتانەوە تا خوای گەورە ئەم کێشەیەتان بۆ یەکلا دەکاتەوە، پاشان بڵاوەیان لێی کرد.

دوای ئەمە چەند ئایەتێکی سەرەتای سورەتی ص دابەزێنرا.



# ساڵی ماتەمینی

ساڵی ماتەمینی پێغەمبەرمان (ﷺ) لە ساڵی دەیەمی پێغەمبەرایەتی بوو ، کە ئەبو طالبی مامی و خەدیجەی خێزانی وەفاتیان کرد

## ١- وەفاتی ئەبو طالب:

نەخۆشیەکەی ئەبو طالب لە پەرەسەندندا بوو، زۆری پێ نەچوو کە لە جێگەی خست و گیانی سپارد. وەفاتی ئەبو طالب لە ساڵی دەیەمی پێغەمبەرایەتیدا بوو، واتە شەش مانگ دوای رزگار بوونیان لە شیوی ئەبو طالب.

کاتێ ئەبو طالب نەخۆش کەوت قورەیش پێیان گەیشت کە نەخۆشیەکەی ئەبو طالب سەختە ، بۆیە بڕیاریاندا کە سەردانی بکەن و ڕێگری بکەن لە موسوڵمان بوونی . ئەم بەسەرهاتەش موسەیەبی کوڕی حەزن ڕەزا و رەحمەتی خوای لێ بێت دەیگێڕێتەوە و دەفەرمووێت :(بۆیە پێغەمبەری خودا (ﷺ) لەکاتی سەرە مەرگی ئەبو طالب دا هات بۆلای و بینی ئەبو جەهلی لەلایە لەگەڵ عبداللهی کوڕی موغیرە، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو : ئەی مامە تۆ لە هەموو کەس زیاتر مافت بەسەر منەوە هەیە لە هەموویان چاکتر بووی بۆم تۆ زیاتر لە دایک و باوکم مافت هەیە بەسەرمەوە بڵێ لا إله إلا الله ئەو وشەیە بڵێ تا تکا کردن بۆت لەسەرم پێویست بێت ، ئەبوو جەهل و عبدالله ڕوویان کردە ئەبو طالب و پێیان وت : ئەی ئەبو طالب ئایا دەتەوێ واز لە ئاینی (عبد المطلب) بێنیت، پێغەمبەریش (ﷺ) بەردەوام ئەم وشەیەی دەدا بە گوێیدا تا دوا وشەی ئەبو طالب ئەوە بوو کە وشەکەی ئەوانی دووبارە کردەوە ).

ئەبو طالب بەم شێوەیە مرد و شایەتیشی نەهێنا بە تاک و تەنهایی خوا.

ئەبو طالب یەکێک بوو لە هەرە دڵسۆزانی پێغەمبەر (ﷺ)وە بەردەوام پەنای پێغەمبەر (ﷺ) دەدا و پارێزگاری لێ دەکرد و بە هەموو جۆرێک پشت و پەنای دەگرت، بەڵام ئەبو طالب سەرەڕای ئەم هەموو باوەڕی بە پەیامی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەبوو، وە بەهیچ جۆرێکیش دژایەتی پێغەمبەر (ﷺ) نەدەکرد بە درۆشی نەدەخستەوە بەڵکو لە هەموو جێیەک، باسی خۆی و هاوەڵانی وە ئاینەکەشی بەچاکە دەکرد بەڵام بێ باوەڕ بوو...

## ٢- وەفاتی دایکە خەدیجە (خوالێی ڕازی بێت).

دایکمان خەدیجە و ئەبو طالب لەیەک ساڵدا مردن. بەمردنی خەدیجە ناخۆشیەکان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) زیادی کرد چونکە یاریدەدەرێکی ڕاستگۆیانە بوو بۆ ئیسلام و پێغەمبەر (ﷺ)، خەدیجە خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) ماوەیەکی زۆر ژیانی لەگەل پێغەمبەردا(ﷺ) بردۆتە سەر وهیچ ژنێکی بەسەردا نەهێناوە ، وە هەموو منداڵەکانی تەنها لەو ئافرەتە بەرێزەیە،جگە لە ئیبراهیم کە لەدایکە "ماریە"یە، بێ گومان زۆر بەچاکە باسی دەکرد، هەرگیز باسی خەدیجەی فەرامۆش نەکردووە و لە یادی نەچووە.

بە مردنی ئەبو طالب ئینجا خەدیجەش ڕەزای خوای لێبێت بەدوایدا، خەم وخەفەت زیادی کرد لەسەر پێغەمبەر (ﷺ).کە دوو کۆڵەکەی بەهێزی ئیسلام بوون، ئەبو طالب پشتیوانی دەرەکی بوو، بەرگری لێدەکرد لە ڕووی خەڵکیدا، خەدیجەش پشتیوانی ناوخۆیی بوو، کە چەرمەسەری و کۆسپەکانی لەبەردەمدا



ئاسان دەکردەوە، بۆیە قورەیش ئەوەی کە نەیان دەوێرا پێشتر بیکەن بەرامبەری لەوە بەدواوەئەنجامیان دەدا، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (قورەیش هەموویان ترسنۆک بوون بەرامبەرم تاکو ئەبو طالب مرد). قۆناغێکی ناهەموار دەستی پێکرد لە ژیانی پێغەمبەر (ﷺ) کە تیایدا ڕووبەرووی گیروگرفت و ناخۆشی زۆر بوویەوە، چونکە تەنیا مایەوە خوا نەبێت پشتیوانی نەما.



## خوازبێنی دایکە سەودەی کچی زمعە خوای گەورە لێی ڕازی بێت:-

لە شەوالی ساڵی دەیەمی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ هاوسەرگیری کرد لەگەڵ دایکە سەودەدا، لەو کەسانە بوو کە دەمێک بوو موسڵمان ببوو و کۆچی دووەمیشی کردبوو بۆ حەبەشە و هاوسەرگیریشی کردبوو، بەڵام هاوسەرەکەی کە ناوی سەکران بوو لە حەبەشە یان لە ڕێگای گەڕانەوەیان بۆ مەککە وەفاتی کردبوو.

یەکەم ئافرەت بوو کە پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ دوای دایکە خەدیجە هاوسەرگیری لەگەڵی کرد.



## دەرچوونی پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ لە طائیف:-

دوای ئەوەی کە پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ و زەید لە طائیف بەردباران کران ناچار بوون بڕۆنە ناو یەکێک لە باخەکانی عوتبە و شیبەی کوڕی ڕەبیعە، کە سێ میل لە طائیف دوور بوو، کە ڕۆیشتنە ناو باخەکەوە ئەوانە گەڕانەوە، و پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ لە ژێر سێبەری دار مێوێک پاڵی دایەوە، کە ئارامبووەوە ئەم نزایەی کرد:-

خوایە لاوازی هێز و کەم توانایی و بێدەسەڵاتیم بە دەست خەڵکەوە بۆ لای تۆ دێنم، ئەی بە بەزەیترینی هەموو بە بەزەییەکان، تۆ پەروەردگاری ژێر دەستەکانی، تۆ خاوەنی منی، بە کێم دەسپێری؟ بە دوورە کەسێک ئازارم بدات؟ یان بە دوژمنێک کارت داوەتە دەست؟ ئەگەر تۆ تورە نەبیت من باکم نییە، بەڵام بێ وەیی کرد تۆ بۆ من دڵگوشاد ترە، پەنا دەگرم بە ڕووی پیرۆزی تۆ، کە هەموو تاریکستانەکانی ڕووناک کردۆتەوە، کاروباری دونیا و ئاخیرەتی لەسەر دامەزراوە، لەوەی تورەیی خۆتم بەسەر دابارێنیت یان خەشمت بمگرێت، ڕاز و نیاز هەر بۆلای تۆیە تا ڕازی دەبیت، ولا حول ولا قوة إلا بك...

پێغەمبەری خوا ﷺ پاش دەرچوونی لە باخەکە بە خەمباری و دڵشکاوییەوە بەرەو مەککە گەڕایەوە، کە گەیشتە (قرن المنازل) خوای گەورە جبریلی ناردە لای

ئەزیزمان ﷺ و فریشتەی شاخەکانی لەگەڵ بوو داوای لێی کرد ڕێگە بدات ئەو دوو کێوەی دەوری مەککە بەسەر خەڵککەدا بدات.

پێغەمبەری نازدارمان ﷺ فەرمووی:- "بەڵکو ئومێد دەکەم خوای گەورە لە پشتی ئەمانەوە نەوەیەک بخاتەوە بە تەنها خوای گەورە بپەرستێت و هیچ هاوبەشێکی بۆ بڕیار نەدات".



## گوێگرتنی جن لەقورئان:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ئاقار ئەو سەرکەوتنە غەیبی‌یەدا هۆشی بەبەردا هاتەوەو دڵی ئارام بۆوە، کە خوای گەورە لە سەروی حەفت ئاسمانەوە بۆی ناردبوو، پاشان بەرِێکەوت بەرەو (مەککە) هەتا گەیشتە شوێنێک پێی دەگوترێ (ألنخلة)و چەند ڕۆژێک لەوێدا مایەوە، لە شیوی (ألنخلة) دوو جێگە هەیە بۆ هەوارگە خستن باشە، کە بریتین لە (السيل الكبير) و (الزيمه)، بەهۆی ئەو ئاوو لەوەڕە زۆرەوە کە تێیاندایە.

لەو ماوەیەدا کە لەوێدا بوو، خوای گەورە چەند کەسێکی لە جنۆکە (جن) بۆ نارد، پێغەمبەر (ﷺ) لەوکاتەدا شەونوێژی دەکرد، ئەو کۆمەڵە لە (جن) گوێیان ڕاگرت بۆ قورئان خوێندنی پێغەمبەر (ﷺ) کە (ابن هشام)[1] دەڵێ حەفت (٧) کەس بوون، بەڵام سەرچاوەکانی دی گوتوویانە نۆ (٩) کەس بوون، دوای ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) نوێژەکەی تەواوکرد، ئەوان گەڕانەوە بۆلای خەڵکەکەی خۆیان، وە ئەو پەیامو بانگەوازەی ئیسلامیان پێڕاگەیاندن، خوای پەوەردگار لە سورەتی (ألأحقاف)دا، ئەو ڕووداوەمان بۆ دەگێڕێتەوە، کە دەفەرموێ : ﴿وَإِذْ صَرَفْنَا إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ الْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ الْقُرْآنَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوا أَنصِتُوا ۖ فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوْا إِلَىٰ

---

[1] ألسيرة النبوية، ج٢، ص ٢١٧، ط دار الهيثم

قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ﴿٢٩﴾ قَالُوا يَا قَوْمَنَا إِنَّا سَمِعْنَا كِتَابًا أُنزِلَ مِن بَعْدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٠﴾ يَا قَوْمَنَا أَجِيبُوا دَاعِيَ اللَّهِ وَآمِنُوا بِهِ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣١﴾ وَمَن لَّا يُجِبْ دَاعِيَ اللَّهِ فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِي الْأَرْضِ وَلَيْسَ لَهُ مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءُ ۚ أُولَٰئِكَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿٣٢﴾)[١]

واتە: یادی ئەو کاتە بکەوە کاتێک کۆمەڵێک لە (جن)مان ناردە لات، جا کاتێک هاتنەلای (هاتنە خزمەت پێغەمبەر ) بە یەکتریان گوت: بێدەنگ بن! (دیارە پێغەمبەر (ﷺ) کە شەونوێژی کردوە بە دەنگی بەرز قورئانی خوێندوە)، دوای ئەوەی کە قورئان خوێندنەکە تەواو بوو، گەڕانەوە بۆلای گەلو کۆمەڵەکەی خۆیانو ئاگاداریان کردنەوەو گوتیان: ئەی گەلەکەمان ئێمە گوێبیستی کتێبێک بووین لەدوای (موسا) نێردراوەتە خوار (کە مەبەست قورئانە) هەموو کتێبەکانی پێش خۆی بەڕاست دەزانێ، خەڵک ڕێڕوونی دەکات بەرەو حەقو بۆ ڕێی ڕاست، ئەی گەلەکەمان بەدەم بانگەوازکەر بۆلای خواوە بچنو ئیمانی پێبێنن، لە گوناحەکانتان خۆش دەبێتو لە ئازارێکی بەئێشیش دەتانپارێزێ. خۆ هەرکەسێک وەڵامی بانگخوازی خوا نەداتەوە، ناتوانێ لە زەوییدا لەدەستی خوا دەرچێو هەڵێ،

[١] الأحقاف



وە جگە لە خواش هیچ کەس نیە دۆستو پشتیوانی بێتو هاوکاری بکات، ئەوانەی باوەڕ ناهێنن لە گومڕایەکی ئاشکرادان.[1]

بەڕاستی ئەو ڕووداوەش سەرکەوتنێکی دیکە بوو کە خوای گەورە لە گەنجینە شاراوەکانی خۆی ئەو سەربازانەی بەخشی بە پێغەمبەر (ﷺ) کە کەس نازانی ژمارەیان چەندە، پاشان ئەو ئایەتانەی لەو بارەیەوە هاتنە خوارەوە لە دووتوێیاندا چەندین مژدەی سەرکەوتنی بانگەوازەکەی پێغەمبەری (ﷺ) تێدابوو کە هیچ هێزێکی گەردونیش ناتوانێت ڕێ لە سەرکەوتنی بگرێت.

ئەو ڕووداوەش ئەوە دەگەیەنێ کە بانگەوازی پێغەمبەر (ﷺ) گشتگیر بووە بۆ جنۆکەو مرۆڤ وە تایبەت نەبووە بە مرۆڤەوە، چونکە (جن)یش وەکو ئێمە موکەللەفن بەوەی کە ئیمان بە پێغەمبەری ئێمە (ﷺ) بێنن، وە موسڵمان بن، وە ئەوانیش کافرو موسڵمانیان هەیە، وەک خوای پەروەردگار بە درێژی لە سوورەتی (ألجن) باسیان دەکات.

[1] لە ڕەوتی ئەو ئایەتانەو، هەروەها ڕەوتی ئەو گێڕانەوانەدا کە لە ڕاڤەی ئەو ڕووداوەدا هاتووە، ڕوون دەبێتەوە کە پێغەمبەر () ئاگای لە ئامادەبوونی ئەو کۆمەڵە (جن)ـە نەبووە، کاتێک پێی زانیوە کە خوای گەورە بەو ئایەتانە ئاگاداری کردۆتەوە، ئەو ئامادەبوونەشیان یەکەم جار بووە، ڕەوتی گێڕانەوەکانیش ئەوە دەخوازێت کە چەند جاری دیش هاتبنەوە.

## گەڕانەوەی پێغەمبەری خودا بۆ مەککە:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەرەو (مەککە) کەوتە ڕێ هەتا لە مەککە نزیک دەبێتەوە، بەڵام خەڵکی مەککە خەبەری بۆ دێنن کە نابێ بێتەوە بۆ مەککە و قبووڵی ناکەینەوە، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) دەچێتە ئەشکەوتی (حراء) ئینجا خەبەر دەنێرێ بۆ هەندێک لە گەورەپیاوانی مەککە کە پەنای بدەن بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە، ئەوانیش دەڵێن کە ناتوانن خەڵک پەنا بدەن لەسەر (قورەیش)، ئینجا دەنێرێ بۆ لای (مطعمی کوڕی عدی)[1] و ئەو دەڵێ: من پەنای دەدەمو، جاڕ دەدات بەنێو (قورەیش)داو دەڵێ: من موحەممەدم پەنا داوە، هیچ کەس ئازاری نەدات! وە سەرەنجام پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ (زید بن حارثه)دا دێتەوە نێو شاری (مەککە)[2].

پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو پیاوەتی یەی (مطعم)ی لەبەرچاو بوو، بۆیە لەبارەی دیلەکانی (بەدر)ەوە فەرمووی: ئەگەر (مطعمی کوڕی عدی) لەژیاندا بوایەو لەبارەی ئەم دیلانەوە قسەی بکردایە هەموویانم ئازاد دەکرد.[3]

---

[1] لێرەدا کە پێغەمبەری خوا () ناچار بووە بچێتە ژێر باڵی کابرایەکی کافر کە دەشزانێ لەسەر (باطل)و کوفریشە، دیارە ناچار بوو، ئەویش لەبەر خواو لەبەر کاری ئیسلامی، ئەگەرنا خزمەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ئامادەبوون هەموو شتێکی بۆ بکەن، بەڵام بەمەرجێک دەست لە دینو بانگەوازەکەی هەڵبگرێ، بەڵام ئەو ئامادە نەبووە بە ئەندازەی تاڵە موویەکیش نەرمیی بنوێنێ لەو بارەوە.

[2] بڕوانە: (تأريخ الأمم والملوك) للطبري ج٢، ص ٢٣١، وە: (ألبداية والنهاية) لإبن كثير، ج١، ص ١٥٩

[3] صحيح البخاري (٢/٥٧٣).



## گەڕان بەسەرهۆزەکاندا وکۆچکردنی هاوەڵانی بۆ مەدینە

دوای دژایەتی توندی چەندین ساڵە دژ بە پێغەمبەر (ﷺ)لە لایەن قورەیش و هاوپەیمانەکانیەوە، دوای ئەو هەموو نارەحەتیەی هاتە سەر ڕێی پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵەکانی و بەزۆر ناچار کردنیان تا مەککە بەجێ بهێڵن و بەرە و حەبەشە و تائیف بکەونە ڕێ .

لە پاش گەڕانەوەی پێغەمبەر (ﷺ) لە تائیف، دەستی کرد بە قسە کردن لەگەل خەڵکیدا و، بانگەوازی هۆزەکانی دەکرد و داوای لێکردن کە داڵدەی بدەن و پشتگیری لێبکەن، بۆ ئەوەی قسەی خوای گەورە بگەیەنێت، پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) لە وەرزە بازرگانیەکاندا جموجۆڵی دەکرد ، هەروەها لە وەرزی حەجدا کە هۆز و عەشیرەتەکانی تیادا کۆ دەبوونەوە .جابر -ڕەزای خوای لێبێت- دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) خۆی نیشانی هۆزەکانی عەرەب دەدا لە کاتی حەجکردن و پێی دەوتن: ئایا کەسێک هەیە من ببات بۆلای خزمان و کەسانی خۆی چونکە قورەیش ڕێگریان کردووم لە گەیاندنی ووتەکانی خوا بە خەڵکی.

پێغەمبەری خودا (ﷺ) زۆر بە وریایی و دانایەوە چاوپێکەوتنی لەگەل هۆزە عەرەبەکان دەکرد لەترسی ئەوەی نەوەک کەسێک لەبت پەرستان ببێتە کۆسپ لە نێوان ئەو و هۆزەکاندا بۆیە چەندین شێوازی جیا جیای گرتۆتەبەر لە سەردانی و چاوپێکەوتنی لەگەل هۆزەکاندا .وەک سەردانی و چاوپێکەوتنی هۆزەکان بە شەو لەگەل ئەوس و خەزرەج هەر لەوێشەوە ،دروستبوونی عەقەبەی یەکەم و دووەم کە هەر بەشەو بوو.



وە ڕۆشتنی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ لای هۆزەکان لەنێو ماڵەکانیاندا، بەو شێوەیەش دەیوست بەدوور بێت لە ڕاونانی قورەیش و، بتوانێت دانوستان بکات لەگەڵ هۆزەکاندا بە شێوازێکی گونجاو، بەبێ هیچ تێکدان و ئاژاوەیەک لە قورەیشەوە. وە هەندێک جار ئەبو بکر و عەلی وەک یاریدەدەر لەگەڵ خۆی دەبرد بۆ هەندێک لە دانوستانەکان.

لە ماوەی ئەم گەڕانانەی سەروەری ئەزیزمان ﷺ شەش گەنجی یەثربی کە هەموویان لە هۆزی خەزرەج بوون موسڵمان بوون و بەڵێنیاندا کە پەیامەکە بە خێزانەکانیان بگەیەنن و ئەوانیش بریتی بوون لە:-

(ئەسعەدی کوڕی زرارە و عەوفی کوڕی حارث و ڕافعی کوڕی مالیک و قوطبەی کوڕی عامر و عەقبەی کوڕی عامر و جابری کوڕی عەبدوڵلا)



## خوازبێنی دایکە عائیشە خوای گەورە لێی ڕازی بێت:-

لە شەوالی ساڵی یانزەیەمی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ خوازبێنی کرد و لە شەوالی ساڵی یەکەمی کۆچی گواستییەوە.

## ڕووداوی شەوڕەوی و کۆچی پێغەمبەر ﷺ:[1]

شەوڕەوی و بەرزبوونەوەی پێغەمبەر ﷺ یان ئیسرا و میعراج (بە عەرەبی: الاسراء و المعراج) بریتییە لەو شەوەی کە پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوتی حەڕامەوە لە مەککەوە کۆچی کرد بۆ مزگەوتی ئەقسا لە قودس، لە ڕێگەی ئاژەڵێکەوە بە ناوی "بووراق" پاشان لە مزگەوتی ئەقساوە بڵندبووەوە بۆ ئاسمانەکان.

لە زمانی عەرەبیدا وشەی "الإسراء" بە واتای شەوڕەوی یان کۆچکردنی شەوانەیە، وشەی "المعراج" واتای بەرزبوونەوە یان بڵندبوونەوەیە.

---

[1] سەرچاوەکان

دروس للإنسانية في إعجاز الله وقدرته.. الإسراء والمعراج-(https://www-aljazeera-net.cdn.ampproject.org/v/s/www.aljazeera.net/amp/blogs

کتێبی السيرة النبوية/ دکتور علي محمد الصلابي

کتێبی الرحيق المختوم/ صفى الرحمن المباركفورى

لە قورئانی پیرۆز ئەم ڕووداوە سەلمێندراوە و تۆمار کراوە، هەروەها تەواوی هاوەڵان باوەڕیان پێ هێناوە، زانایانی ئیسلامیش پشتڕاستیان کردووەتەوە .

## وردەکاری ڕووداوی شەوڕەوی و کۆچی پێغەمبەر ﷺ

بەپێی دەقی قورئانی و پشتڕاستکردنەوەکانی زانایان و گێڕانەوەکانیان نموونەی ئیبنولقەییم ڕووداوی شەوڕەویی بەم شێوەیە دەگێڕنەوە، گرنگترین بەشی ئەوە بووە کە جەستە و ڕۆحی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ لەو ڕووداوە ئامادەبوو و ئەو ڕووداوە خەوبینین و خەیاڵ نەبووە، ڕووداوەکە بە کۆچ و شەوڕەوی پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوتی حەرامەوە بۆ مزگەوتی ئەقسا لە قودس بە سواری "بووڕاق" و بە هاوەڵی "جوبریل" (سەلامی خودای لەسەر بێت) ڕوویداوە، پێغەمبەر ﷺ لە قودس دابەزیوە و پێشنوێژی بۆ هەموو پێغەمبەرەکانی تر کردووە، پاشان هەر ئەو شەوە لە (بیت المقدس)ەوە بەرزکرایەوە بۆ ئاسمانی دونیا و دەرگای بۆ کرایەوە و هەر لەوێ پێغەمبەر "ئادەم"ی بینی (سڵاوی خودای لەسەر بێت) ئەویش دانی نا بە پێغەمبەرایەتیدا، پاشان سەرخرا بۆ ئاسمانی دووەم و لەوێ هەر یەک لەپێغەمبەران "یەحیا" و "عیسا"ی بینی (سەلامی خوایان لەسەربێت) ئەوانیش پێغەمبەرایەتیان سەلماند، پاشان بۆ ئاسمانی سێیەم بەڕێکەوت و لەوێش پێغەمبەر "یوسف"ی بینی ئەویش دانی نا بە پێغەمبەرایەتیدا، پاشان



بەرەو ئاسمانی چوارەم سەرخرا، لەوێش "ئیدریس" پێغەمبەری بینی و ئەویش پێغەمبەرایەتی سەلماند، پاشان سەرخرا بۆ ئاسمانی پێنجەم کە "هارونی کوڕی عیمرانی" بینی، ئەویش پاش بەخێرهێنانی دانی نا بە پێغەمبەرایەتی، لە ئاسمانی شەشەمیشدا بە موسای پێغەمبەر گەیشت، ئەویش هەر وەکو پێغەمبەرەکانی تر پێشوازی لێکرد، لە ئاسمانی حەوتەمدا بە پێغەمبەر ئیبراهیم شاد بوو، لەلایەن ئەویشەوە پێغەمبەرایەتی سەلمێندرا، دواتر چووە "سدرة المنتهى" کە لە ئاسمانی حەوتەمە ئەو شوێنەیە کە هیچ کەس بۆی نییە بچێتە ئەوی تەنانەت فریشتەکانیش، پاشانیش چووە "بیت المعمور" کە هاوشێوەی "بیت الحرام"ە لە ئاسمان و فریشتەکان بە دەوریدا دەخولێنەوە و ستایشی خودا دەکەن، پاشان بەرزتر بووەوە تا لە خودای گەورە نزیکتر بووەوە، لەم قۆناغەدا سرووشی بۆ هات و چەندان فەرمایشتی گرنگی بۆ ڕوونکرایەوە، لەوانە خودای گەورە (٥٠) ڕکات نوێژی لەسەر ئوممەتەکەی فەرز کرد، پاشان بە ڕاوێژی پێغەمبەر موسا تکای لە خودا کرد هەتا بۆی کەمکردەوەو کردی بەم پێنج نوێژەی ئێستا.

ئاشکراکردنی ڕووداوەکە بۆ بێباوەڕان مایەی سەرسوڕمان و شۆک بوو، بەشێکی زۆریان گاڵتەجاڕییان پێدەهات، بەڵام ئەبوبەکری سدیق یەکەم کەس بوو بە تەواوی باوەڕی بە هەموو ڕووداوەکە هێنا لەم ڕووداوەیشەوە نازناوی "سدیق" ڕاستگۆی پێدرا.

## هۆکاری گەشتی شەوڕەوی و بڵندبوونەوەی پێغەمبەر ﷺ

ئەم ڕووداوە وێنای دڵنەواییکەر و کەمکردنەوەی ئازار و خەمەکانی پێغەمبەر ﷺ بوو، چونکە لەو ماوەیەدا خاتوو خەدیجەی خێزانی کە پاڵپشت و دڵنەوایی هەمیشەیی بوو، لەگەڵ ئەبوتاڵیبی مامی کە پشتیوان و هاوکاری و پارێزگاریکەی بوو کۆچی دواییان کرد.

لە دوای ئەوەی قوڕەیشییەکانی مەککە بە هەموو شێوەیەک ئازاری پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانیان دەدا و ڕووبەڕوویان دەبوونەوە، پێغەمبەر ﷺ بڕیاری دا بە مەبەستی پشتیوانی و هاوکاریکردنی بچێتە ناوچەی "تائیف" و پەیامەکەی لەوێ بڵاوبکاتەوە، بەڵام لەلایەن خەڵکی ئەو ناوچەیە پەیامەکەی ڕەتکرایەوە و بە خراپترین شێوە بەرپەرچیان دایەوە، تەنانەت پێغەمبەری خودایان بەردباران کرد، لە دوای ئەم ڕووداوە و گەڕانەوەی بۆ شاری مەککە قوڕەیشییەکان زیاتر ڕووبەڕووی بوونەوە و ڕێگریان دەکرد کە بچێتە نزیک کەعبە و پەرستشەکانی ئەنجام بدات چونکە ئازارێکی زۆریان دەدا، هەموو ئەمانە هۆکاری ئەوە بوون کە ئەو ساڵە ناو بنێن "ساڵی خەمباری" چونکە پێغەمبەر ﷺ دووچاری خەم و ئازار و مەینەتی زۆر بووەوە.



لە پاش هەموو ئەم ڕووداوانە، ڕووداوی شەوڕەوی و کۆچ بووە ڕووداوێکی دڵنەواییکەر و بەرپەرچدانەوەی بێباوەڕان، هەروەها بووە بەهێزترین دەرئاسا و موعجیزە و بەڵگەی پێغەمبەر ﷺ بۆ ڕاستگۆیی پەیامەکەی.

## کاتی ڕووداوی ئیسرا و میعراج

زانایانی ئیسلام لەسەر کات و ڕۆژی ڕووداوەکە کۆک نیین، چەندان بۆچوون هەیە لەسەر ساڵ و کاتی ئیسرا و میعراج، ناودارترین بۆچوون وتەکانی "الزوهری"ە کە پێی وایە بە ساڵێک پێش کۆچکردن بۆ مەدینە ئەم ڕووداوە ڕووی داوە و بە دیاریکراوی دوای گەڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ لە گەشتەکەی لە ناوچەی تاییف.

هەر یەک لە ئیمامی نەوەویی و ئیمامی قورتوبی دەڵێن ئەو ڕووداوە بە پێنج ساڵ پاش پێغەمبەرایەتی بوو، هەروەها نووسەری کتێبی (الرحیق المختوم) دەڵێت لە ٢٧ی ڕەجەبی ساڵی ١٠ی پێغەمبەرایەتیدا بوو.

زۆرێک لە زانایانی بە دیاریکراوی شەوی ٢٧ی مانگی ڕەجەبیان بۆ ئەو ڕووداوە دیاری کردووە .

## ڕووداوی ئیسرا و میعراج لە قورئای پیرۆزەوە

چەمکی ئیسرا یان شەوڕەوی کە بە واتای کۆچکردنی پێغەمبەر لە مزگەوتی حەڕەمی مەککەوە بۆ مزگەوتی ئەقسای قودس لە ئایەتی یەکەمی سوڕەتی "الإسراء" بە ڕوونی ئاماژەی پێکراوە، خودای گەورە دەفەرموێت: **{سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِ لَيْلًا مِنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الْأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا ۚ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ}**، واتا: پاك و بێگەردی بۆ ئەو خودایەی کە شەوڕەوی بە بەندەی خۆی محمد ﷺ کرد لە کەعبەی پیرۆزەوە بۆ مزگەوتی ئەقسا لە "بيت المقدس"، کە دەوروبەری "بيت المقدس"مان پڕ خێر و بەرەکەت کردووە بە بەرووبووم و ئاو و دابەزینی وەحی و ناردنی پێغەمبەران و شوێنی پیاوچاکان، بۆیە شەوڕەویمان بەو بەندەیەی خۆمان کرد تاکوو هەندێك لە موعجیزە و بەڵگە سەرسوڕهێنەرەکانی خۆمانی نیشان بدەین، بە دڵنیاییەوە هەر خودای گەورەیە کە بیسەر و بینەرە.

لەم ئایەتەوە بەڵگەی ڕاستی و دروستی ڕووداوەکە سەلمێنرا، وشەی "الْأَقْصَى" بەکارهێنرا کە واتای "ئەوپەڕ"ە لەبەر ئەوەی لەو کاتەدا لەو ناوچەیەدا هیچ مزگەوتێکی تر نەبووە سەردانیکردنی ئەقسا لە مەککەوە چەندان ڕۆژی ویستووە، هەروەها خودای گەورە ئاماژەی بە خودی بێغەمبەر ﷺ کردووە بەوەی دەفەرمووێت "بِعَبْدِهِ" بە بەندەکەی خۆی وەکوو ڕێزێک بۆ پێغەمبەر ﷺ لەبەر



ئەوەی بەندایەتی بەرزترین پلەیە، هەر ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە شەوڕەوی بە جەستە و ڕۆح بووە، چونکە عەبد یان بەندە بریتییە لە جەستە و ڕۆح، لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ بەخەبەر و بە ئاگا بووە نەخەوتووە، چونکە ئەگەر لە خەودا بوایە هیچ کەس لە بێباوەڕان نکوڵیان لێ نەدەکرد، چونکە لە خەودا مرۆڤ هەر شتێك ببینێت ئاساییە.

ڕووداوی میعراج بەرزبوونەوەی پێغەمبەر ﷺ بەرەو ئاسمانەکان وبینینی پێغەمبەرانی تر لە سورەتی "النجم" ئایەتی ١٨ ئاماژەی پێکراوە و خودای گەورەدەفەرموێت: (لَقَدْ رَأَىٰ مِنْ آيَاتِ رَبِّهِ الْكُبْرَىٰ)، واتا: بە ڕاستی پێغەمبەر ﷺ گەلێك بەڵگە و نیشانەی مەزنی پەروەردگاری خۆی لە سەفەرەکەیدا بینی وەك (سدرة المنتهى) و (بيت المعمور) و بەهەشت و دۆزەخ و پێغەمبەران و چەندانی تر.

پاش ئەو ڕووداوە قۆناغێکی تری بانگەوازی دەستی پێکرد، بەم ڕووداوە گرنگە ئاسۆی ئاسمانی لێدرەوشایەوە و هیوا و ئومێدێکی بە پێغەمبەر ﷺ و بە یارانی بەخشی.

## پەیماننامە(بەیعەت)ی عەقەبەی یەکەم:-

پێشتر ئەو شەش کەسەی خەڵکی یەثرب کە لە وەرزی حەجی ساڵی یانزەیەمی پێغەمبەرایەتی موسڵمان بوون بەڵێنیان بە پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ دا کە پەیامەکەی بە کەسوکارەکانیان بگەیەنن.

لە ئەنجامی ئەمەدا کە وەرزی داهاتووی حەج هات واتە لە ساڵی دووانزەیەمی پێغەمبەرایەتی ١٢ پیاو هاتنە خزمەتی پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ، پێنجیان هی ساڵی پێشوو بوون و حەوتیان نوێ بوون، و ئەو حەوتەش پێنجیان لە هۆزی خەزرەج و دوویان لە هۆزی ئەوس بوون، و ئەمان لە "عەقەبەی مینا" پەیمان(بەیعەت)یان بە پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ دا.

کە وەرزی حەج تەواو بوو پێغەمبەری سەرورەرمان ﷺ "موصعەبی کوڕی عومەیر"ی وەکو نوێنەری خۆی لەگەڵ ئەم کۆمەڵەیە نارد بۆ یەثرب بۆ ئەوەی شەریعەتی ئیسلام فێری موسڵمانەکانی یەثرب بکات و لە ئایینی ئیسلام شارەزایان بکات و ئیسلام بڵاو بکاتەوە.

موصعەب هەوڵێکی زۆر و بەردەوامی دا بە ڕادەیەک بوو کە لە ماوەی ساڵێکدا هیچ ماڵێکی ئەنصار(پشتیوانان) نەما ئافرەت و پیاوی موسڵمانی تێدا نەبێت جگەلە ماڵی (بەنی ئومەیەی کوڕی زەید و خطمە و وائل)، چونکە "قەیسی کوڕی ئسلت"ی شاعیریان تێدابوو و ئەوانیش بە گوێیان دەکرد، ڕێگەی نەدا موسڵمان بن تاکو شەڕی خەندەق کە لە ساڵی پێنجەمی کۆچیدا بوو.

پێش هاتنی وەرزی حەجی ساڵی داهاتوو، واتا ساڵی سیانزەهەم موصعەب گەڕایەوە و موژدەی ئەم سەرکەوتنە مەزنەی بە پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ گەیاند، و باسی



بەسەرهاتی خێڵەکانی یەثرب و بەهرەی چاک و لێهاتووی خەڵکی شارەکەی گێڕایەوە.

### بەیعەتی عەقەبەی دووەم:-

لە ساڵی سیانزەیەمی پێغەمبەرایەتیدا حەفتا و ئەوەندە کەس لە موسڵمانەکانی یەثرب لەگەڵ حاجییە هاوەڵدانەراکانی خێڵەکانیاندا کۆچیان کرد بۆ مەککەی پیرۆز، کە گەیشتنە مەککەی پیرۆز چەند پەیوەندییەکی نهێنی لە نێوان ئەوان و پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ ئەنجامدرا، کە بووە هۆی ئەوەی لە ڕۆژانی تەشریق لە ئەو شیوە کۆ ببنەوە کە دەکەوێتە لای عەقەبە لە حجرەی یەکەمی مینا، بە مەرجێک ئەو دانیشتنە لە تاریکی شەودا بە نهێنییەکی تەواو ئەنجام بدرێت.

دواتر وەکو ئەوەی ڕێککەوتن ڕۆیشتنە شیوەکە و چاوەڕێی هاتنی پێغەمبەری ئەزیزمانیان دەکرد ﷺ، پێغەمبەرمان ﷺ خۆی و عەبباسی کوڕی عەبدولموطەڵیبی مامی هاتن، هەرچەندە لە ئەو کاتەش عەبباس هاوەڵدانەر بوو، بەڵام ویستی ئامادەی کاری برازەکەی ببێت و لێی دڵنیابێ و یەکەم کەس بوو دەستی کرد بە قسە کردن و کۆمەڵێ قسەی پێیان فەرموو و کورتەی قسەکەی ئەمە بوو:-

مُحمد کەسی ئێمەیە و لەسەر ئەو بیروباوەڕەی کە هێناویەتی پاراستوومانە و نەمانهێشتووە هیچ کەس دەستدرێژی بکاتە سەری و سەر بڵندە لە ناو هۆزەکەی، ئەو دەیەوێت بێتە لای ئێوەوە گەر دەزانن ئەو پەیمانەی پێتانداوە دەتوانن بیبەنە سەر ئەوە فەرموون بەرپرسیارێتی لەسەر شانی خۆتانە، گەر دەزانن ناتوانن

بیکەن و دوای ڕۆیشتنتان لێرە ڕادەستی دەکەن و سەری شۆڕ دەکەن لە ئێستاوە وازی لێ بهێنن، چونکە ئەو لە ناو کەسوکاری خۆی پارێزراو و سەربڵندە.

ئەوانیش پێیان فەرموو هەرچییەکت فەرموە گوێمان لێبوو، پێغەمبەری خوا ئێستا جەنابت بفەرموو و خۆت و خودای خۆت چیتان پێخۆشە ئەوە بکە.

دوای ڕوونکردنەوەی مەترسی و خاڵەکانی بەیعەتەکە هەموویان دانە پەیمانیان دەدا بە پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ، و ئەویش بەڵێنی بەهەشتی پێیان دەدا، و بەیعەتی دوو ئافرەتەکەش تەنها بە دەم بوو، واتە دەستیان بەر دەستی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ نەکەوت، و پێغەمبەری سەرووەرمان ﷺ لە ژیانیدا دەستی بەر دەست ئافرەتانی جگەلە خانەوەداکەی نەکەوتووە.

و دواتر پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ داوای لێیان کرد ١٢ کەس وەکو سەرکردەی کەسەکانیان دیاری بکەن، دوای دیاری کردنی بەڵێننامەیەکی تری لێیان وەرگرت، بەو سیفەتەی کە ئەوان سەرۆک و بەرپرسن.

و هەروەها پێیانی فەرموو ئێوە وەکو کەفالەتیی حەوارییەکانی عیسا کوڕی مەریم دەبنە کەفیلی سەر گەلەکەتان، و منیش کەفیلی سەر ئومەتەکەمم(واتە موسڵمانەکان)، وتیان بەڵێ وایە.

لە ئەم کاتانەدا کەسێکی فێڵباز ڕۆیشتە سەر گردۆڵکەیەک و بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد ئەرێ خەڵکێ شار بۆ نایەن بۆ سەیری محمد و شوێنکەوتووانی؟

ئەوەتا بۆ جەنگی ئێوە کۆبوونەتەوە.

کاتێک پێغەمبەری خۆشەویستمان و بەیعەتداران گوێیان لێ بوو پێغەمبەری سەرووەرمان ﷺ فەرمانی پێیان کرد بڵاوە بن و بڕۆنە شوێنی حەوانەوەی خۆیان.



قورەیشییەکان بە بیستنی ئەمە زۆر دڵگران بوون و ترسان و کەوتنە دڵەڕاوکێوە، بۆیە بۆ بەگژداچوونەوەی ئەمە هەرکە بەیانی داهات شاندێکی گەورە لە پیاو ماقوڵانیان ڕۆیشتنە لای خێوەتگەکانی یەثرب.

لەگەڵ خەزرەجییەکان قسەیان کرد، و بە حوکمی ئەوەی هاوەڵدانەرەکانی خەزرەج بێئاگا بوون لە بەیعەتەکە بۆیە سوێندیان خوارد کە شتی وەها نییە، و موسڵمانەکانیش سەیری یەکتریان دەکرد و بێدەنگ بوون و هیچیان نەوت، و بەم شێوەیە قورەیشییەکان باوەڕیان کرد و گەڕانەوە.

قورەیشییەکان خەریکبوو تەواو باوەڕبکەن بەڵام پاش ماوەیەک کە شوێن موسڵمانان کەوتن بۆیان ئاشکرا بوو کە ڕاستە و بەیعەتەکە ئەنجامدراوە و کۆتایی پێهاتووە.

کاتێک کە بۆیان ئاشکرا بوو یەثربییەکان گەیشتبوونە جێگای خۆیان، و لە ڕێگا کە شوێنیان کەوتبوون (سەعدی کوڕی عەبادە) و (مونذری کوڕی عەمرو)یان بەدی کرد، مونذر توانی هەڵبێت، بەڵام سەعدیان دەستگیر کرد و زۆر ئەشکەنجەیاندا تا گەیشتنە ناو مەککەی پیرۆز و لەوێدا (موطعم) و (حارثی کوڕی حەرب) هاتن و ڕزگاریان کرد.

## سەرەتاکانی کۆچکردن بۆ مەدینە:-

دوای بەیعەتەکانی عەقەبە سوپاس بۆ خوای گەورە ئیسلام زۆرتر بڵاو بوویەوە و موسڵمانان بوونە خاوەن نشتیمانێک کە بتوانن تێیدا بە ئازادی و ئاسوودەیی بژین و خواپەرستی خۆیان بکەن، بۆیە پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ فەرمانی بە موسڵمانان کرد کۆچ بکەن بۆ مەدینە.

سەرەڕای ڕێگرییەکانی قورەیش و ئازار و ئەشکەنجەکانیان بۆ سەر ئەو موسڵمانانەی کە پێیان دەزانی کۆچ دەکەن بەڵام موسڵمانان پۆل پۆل و بە تاک کۆچیان دەکرد بۆ مەدینەی پیرۆز، بە ڕادەیەک بوو دوای دوو مانگ و چەن ڕۆژێک لە بەیعەتی عەقەبەی دووەم کە ناسراوە بە بەیعەتی عەقەبەی گەورە لە شاری مەککەی پیرۆز تەنها پێغەمبەری ڕابەرمان ﷺ و ئەبو بەکری صدیق و عەلی کوڕی ئەبی طالیب (خوای گەورە لێیان ڕازی بێت) مابوونەوە، جگەلە ئەو کەسانەی هاوەڵدانەران دەستگیریان دەکرد و ڕزگاربوونیان ئاسان نەبوو.



## پیلانی دار الندوه (پەرلەمانی قورەیش)

کاتێـک قـورەیش زانیـان پێغەمبەر ﷺ و هـاوەڵانی لایەنگریـان بـۆ دروسـت بـوو لە شارێکی تردا جگە لە شاری مەککە و دەرچوونی هاوەڵانیان بینی بەرەو مەدینە، بە کۆچکردنیان بۆ مەدینە قورەیشیەکان ڕق و تورەییان زیاتر بوو، چونکە لەو هێزە سیاسیە بەهێزەی داهاتوو دەترسان کە پێغەمبەر و هاوەڵان لە مەدینەدا دروستی دەکەن، لەبەرئەوە بڕیاریاندا ڕێی لێ بگرن و پیلانێکی گەورە دژی پێغەمبەر بگێڕن، بـۆیە لە (دارولـنەدوە) کۆبـونەوە، هەیـانبو دەیـوت: "بـا مـوحەممەد شـار بەدەر بکەین"، لە وەڵامدا وتیان: "بێ سودە چونکە لە دەرەوەی مەککە هێزێك دروست دەکات و دێـتەوە سـەرمان"، هەنـدێکی تریـان وتیـان: "بەنـدی دەکەیـن"، زانیـان ئەوەش بێ سـودە، هەتـا هـاتنە سـەرئەوەی کە کوشـتن باشـترین ڕێگایە و یەکجـاری ڕزگاریـان دەبێـت، بەڵام لەم ڕێگایەدا کێشـەیەك هـاتە بەردەمیان کە بوبـوە کۆسـپ لەبەردەم جێ بەجێ کردنیـدا، ئەویـش ئەوەبـوو کە کەس نەیـدەتوانی بیکوژێـت، چـونکە هـۆزەکەی پێغەمبەر لەو کەسـە نەدەگەڕان و دەسـتبەجێ دەیانکوشـتەوە، بـۆیە بڕیاریانـدا لەهەر هۆزێـک کەسـێکی بەهێـز و چـوار شـانە دیـاری بـکەن بـۆ کوشـتنی پێغەمـبەری خـودا (ﷺ) بەم شـێوەیەش خـوێنی پێغەمـبەری خـودا لەنـاو هۆزەکانی عەرەبدا ون دەبوو و بنەماڵەی عەبدولمەناف ناتوانن ڕووبەڕووی هەموو هێزەکـانی عـەرەب ببـنەوە پـیلان بـۆدارێژەری ئەم بیرۆکەیەش ئەبـو جەهلی کـوڕی هیشام بوو.

**دوای ئەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بڕیاری کۆچ کردن دەدات بۆ مەدینە...**